# ناوەڕۆک

بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەکی:

**الحمد لله الواحد الأحد الذى لم يلد ولم يولد وله الحمد في الأولى ولآخرة وله الحكم وإليه ترجعون وصلى الله على نبينا محمد الأمين وسيد المرسلين وخاتم النبيين وعلى آل وأصحابى، أما بعد.**

هیجرەت ناوێکی گەورە و لەیادکراو بێگومان لەم سەردەمەدا دین بەشێوەیەکی گشتی لەبیربردراوە و زۆر پایەی ئەم دینە فەرامۆشکراوە و داهێنان کراوە و واز لە زۆرێک لە پایەکانی ئیسلام هێنراوە، وەک ئیمامی "بربهاری" رحمه الله لە شەرحی (سنه للبرهاری)دا دەڵێت: هیچ بیدعەیەک یان زیادکراوێک نییە هاتبێتە نێو دین، ئەوا لەبەرامبەری واز لە بەشێکی دین هێنراوە. واتە ئەم بەشەی کە حەق بووە بە باطل ڕووپۆش دەکرێت. یەکێک لەو باس و پایانەی دین کە بناغەی عەقیدەیەکی پاکن ئەوەیە کە دەرخەری ڕاستگۆیی ئیماندارە، واتە قۆناغێکە لەقۆناغەکانی عەمەلی واتە کردەوەیی کە ئیماندار ئەنجامی بدات بریتییە لە هیجرەت واتە کۆچکردن لەپێناو ژیان، وەک




دەڵێن کۆچی باڵندە لەوەرزێکەوە بۆ وەرزێکی تر و لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر بۆچییە؟ لەپێناو ژیانە ئەمە بە مانا ڕووکەشیەکەی، بەڵام هیجرەت بە واتا دینییەکەی یان لەڕوانگەی شەرعەوە بەواتای جێهێشتنی کوفر بەرەو ئیمان. بۆنمونە لەشارێکی کوفری دەچیت بەرەو شارێکی ئیمانی وەک کۆچی پێغەمبەری ئازیز ﷺ لە شارێکی کوفری و شیرکی کە مەککە بوو بەرەو شارێکی ئیمانی کە مەدینە بوو. لەم ڕۆژگارەدا بەداخەوە خەڵک دوای داخستنی دەرگای عەقیدە و ئیمان ئەوا دەرگای هیجرەتیشیان داخست، کاتێک ناوی هیجرەت بێت، دەڵێن کوا بۆکوێ هیجرەت بکەین کوا شوێنێکمان پێ بڵێن حوکمی ئیسلامی لێبێت. بەڵام الله تعالی وەڵامی ئەم پرسیارەمان دەداتەوە، قال الله تعالی: ﴿يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ أَرۡضِي وَٰسِعَةٞ فَإِيَّٰيَ فَٱعۡبُدُونِ ٥٦﴾[1].

ئەم ئایەتە بەڵگەیە بۆ ئەوەی الله فەرمانی پێکردووین بەوەی زەوی خوا زۆر گەورە و فراوانە لەکوێ ڕێگای عیبادات و پەرستنمان هەبێت لەم شوێنە دینداری بکەین. بەواتایەکی تر زەوی لەسەر خۆمان تەسک نەکەینەوە لەم شارە ڕێگری

١ سورة العنكبوت: ٥٦

بەندایەتی الله و دەربڕینی حەقمان لێبگیردرێت دەبێت کۆچ بۆ شوێنێکی تر بکەین تا بەندایەتی تێدا بکەین کە پشتیوان بە الله بەوردی گرنگی و پایە و قۆناغەکانی هیجرەت باس دەکەین.

## باسی یەکەم: هیجرەت چییە و بۆچییە؟ هجرەت لەکۆنەوە تا هاتنی ئیسلام

بێگومان هیجرەت یان کۆچ بەکوردی لایەنی ڕێزمانی و واتایی، مانای جۆراو و جۆری هەیە بەڵام ئێمە کارمان بەلایەنە شەرعیەکەیەتی کە بۆچییە یان چییە و لەپێناو چییە.

هیجرەت لەڕوانگەی دیندا واتە کۆچ (في سبيل الله) لەپێناو اللهدا و بۆ الله. هەر لەکۆنەوە هیجرەت هەر هەبووە و بەردەوامیشە تا ئەمڕۆ.

### ١. هیجرەتی ئیبراهیم علیه سلام

قال الله تعالى ﴿وَقَالَ إِنِّي ذَاهِبٌ إِلَىٰ رَبِّي سَيَهْدِينِ ﴿٩٩﴾﴾[1] موفەسیران هەریەک لە ئیمامی "جرير بن طبرى" و ئیمامی "إبن كثير" لەبارەی ئەم ئایەتە مەبەست پێی کۆچە دوای ئەوەی الله ڕزگاری

١ سورة الصافات: ٩٩

دەکات لەو ئاگرەی کە بۆیان دانا و ئەڵێن مەبەست پێی زەوی پیرۆزە کە شام بووە. واتە کۆچ لەنێو گەلێکی کافر و موشریکەوە بۆ زەویەکی تر، چونکە وەک مەعلومە "إبراهيم" عليه سلام دەعوەی باوک و قەومەکەی کرد بۆ تەوحید و یەکخواپەرستی و دوورکەوتنەوە لە بەندایەتیکردنی شیطان وەک إبراهيم عليه سلام بەباوکی دەوت، قال الله تعالى: ﴿يَٰٓأَبَتِ لَا تَعۡبُدِ ٱلشَّيۡطَٰنَۖ﴾ ئەمە و چەندان ئایەتی تر، بەڵام وەڵامی قەومەکەی دیار بوو چی بوو، ئەوەبوو ئاگرێکی زۆر گەورەیان بۆ کردەوە و فڕێیان دایە نێوی. لە صەحیح بوخاریدا هاتووە (کاتێک إبراهيم عليه سلام فڕێ دەدەنە نێو ئاگر دەفەرمووێت 'حسبى الله ونعم الوكيل'). بێگومان وەڵامی الله زۆر خێرا بوو بەم ئایەتە، قال الله تعالى: ﴿قُلۡنَا يَٰنَارُ كُونِي بَرۡدٗا وَسَلَٰمًا عَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ ٦٩﴾[1].

ئەوەبوو ئیبراهیم ڕزگاری بوو بۆیە هیجری گەلەکەی کرد و لەبارەی کۆچی ئیبراهیم عليه سلام لە صەحیح بوخاریدا هاتووە، کاتێک إبراهيم عليه سلام خێزان و إسماعيل عليه سلام لەمەککە بەجێدەهێڵێت. "هاجر" بانگ دەکات ئەی ئیبراهیم چەند جارێک لەڕیوایەتێکدا دەڵێت ئیبراهیم وەڵام ناداتەوە و

١ سورة الأنبياء: ٦٩

دەڕوات، بەڵام دەڵێت فەرمانی اللەیە بۆم، خێزانیشی دەڵێت ڕازیم بە فەرمانی اللە.

لە ڕیوایەتێکی تردا إبراهیم علیه سلام دەگەڕێتەوە و دەست بەرز دەکاتەوە و ئەم دووعایانە دەکات. قال سبحان وتعال: ﴿رَّبَّنَآ إِنِّيٓ أَسۡكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيۡرِ ذِي زَرۡعٍ عِندَ بَيۡتِكَ ٱلۡمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱجۡعَلۡ أَفۡـِٔدَةٗ مِّنَ ٱلنَّاسِ تَهۡوِيٓ إِلَيۡهِمۡ وَٱرۡزُقۡهُم مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمۡ يَشۡكُرُونَ ٣٧﴾[١].

واتە پێش دروستکردنی کەعبە و بەیت ئەم زەوییە زەوییەکی ڕەق و وشک بووە ئا لەم بیابانە ژن و منداڵی ساوا جێدەهڵێت في سبیل اللە. کەواتە هیجرەت قوربانیەکی زۆری دەوێت و ئیمانێکی پتەوی دەوێت. إبراهیم علیه سلام ئومەتێکی (قانت) بوو و (لله وحنیف) بوو، بۆیە ژن و منداڵ لەم بیابانە في سبیل اللە بەجێدەهێلێت. بێگومان ئەو اللەی کەوا لەنێو ئاگر ڕزگاری کرد هەر ئەمیش ئاوی زمزمی بۆ ژن و منداڵەکەی دابین کرد.

کەواتە کۆچ لەدین لەپێناو اللەیە بۆ ڕەزامەندی اللەیە و هۆکاری کۆچیش کافر و موشریکانن کە ڕێگرن لە دینی اللە و ئیمانداران کاتێک ئبراهیم علیه سلام داوای (لا اله الا الله)ی

---

١ سورة إبراهيم: ٣٧

لێکردن ویستیان بیکوژن، بۆیە هیجری کردن بۆ چوونە خاکێکی تر لەپێناو بانگەوازی تەوحید.

## ٢. هیجرەتی موسا علیه سلام و گەلەکەی

کاتێک الله فەرمان بە موسا علیه سلام دەکات بچێت بۆ لای فیرعەون و بانگەوازی حەقی لەلا بکات. چونکە فیرعەون کافرێکی سنور بەزێن بوو، الله بە طاغوط وەسفی کردووە چونکە دەیفەرموو قال الله تعال: ﴿أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلۡأَعۡلَىٰ ٢٤﴾ ئنجا دەی وت، قال الله تعالى ﴿مَا عَلِمۡتُ لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرِي﴾ و جگە لەوەش ستەمکارێکی دڕەندە بوو بەنو ئیسرائیلی دەکوشت و دەیکردنە کۆیلە ئەمیش قال الله تعالى: ﴿يُذَبِّحُ أَبۡنَآءَهُمۡ وَيَسۡتَحۡيِۦ نِسَآءَهُمۡۚ﴾ منداڵەکانی سەردەبڕین و ژنەکانیشی دەکرد بە کۆیلە و خزمەتکار. بۆیە الله پێی دەڵێت، قال الله تعالى سورەتی یونس ﴿وَإِنَّ فِرۡعَوۡنَ لَعَالٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَإِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ٨٣﴾.

بێگومان ئەمە ئەوپەڕی کوفر و ڕۆچوونە لە کیبردا. بۆیە مووسا علیه سلام پێی دەڵێت، قال الله تعالى: ﴿أَنۡ أَرۡسِلۡ مَعَنَا بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ١٧﴾ موفەسیران لەبارەی ئەم ئایەتە واتای چیدی ئازار و ئەشکەنجەی بەنو ئیسرائیل مەدە و مەیانکە بە عەبد و بیان

کوژی. هەریەک لە "البغوی" و "سعدی" دەڵێن ژمارەی بەنو ئیسرائیل ئەم کات شەش سەد و شتێک هەزار کەس بوون، بۆیە دوای ئەوەی فیرعەون و هامان و سەربازەکانی ملیان کەچ نەبوو بۆ حەق دوای ئەوەی بەچەندان بەڵگە و بورهانی پێش وەقت، هەروەها ناردنی خوێن و بۆق و کوللە و بۆچی بوو ﴿لَعَلَّهُمۡ يَتَذَكَّرُونَ﴾. بەڵام بەدرۆیان زانی بۆیە الله فەرمانی بە موسا علیه سلام کرد بەنو ئیسرائیل واتە نەوەکانی پێغەمبەر یعقوب علیه سلام لەگەڵ خۆی بەرێت و هیجرەت بکەن بۆچی؟ چونکە لە وڵاتێکی کوفری و شیطان پەرستی جێگای بەندایەتی الله لێنابێتەوە کەواتە دەبێت هیجرەت بکەن. کەواتە ئەوەی گرنگە هۆکاری هیجرەتی موسا و گەلەکەی کوفری کافران بوو کە رێگربوون لە تەوحید و یەکخواپەرستی ﴿وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ بەهەموو شێوەک، بۆیە فەرمانی هیجرەت کرا گەر فیرعەون و قەومەکەی موسا و هارونیان بە راست دانابا موسا و گەلەکەی هیجرەتیان نەدەکرد.

### ٣. هیجرەتی أصحاب الکهف

بێگومان زۆرینەمان وەک ناوی خۆمان لەم بەسەر هاتە شارەزایین. یارانی ئەشکەوت کۆمەڵە ئیمانداریکی موتەقی و الله

پەرست بوون کە موفەسیران وەک إبن کثیر و إبن جریر طبری و البغوی دەڵێن لەسەردەمی مەسیحیەتدا بووە، واتە دوای هاتنی پێغەمبەر عیسا علیه سلام لەم نێوەنەدەدا واتە لەنێوان پێغەمبەر عیسا علیه سلام و محمد (الأمین)دا ڕوویداوە و ڕوودانەکەش ئەوەبووە (الرقیم) بەشێک لە موفەسیران دەڵێن ئەم دۆڵەی ئەشکەوتەکەی لێبووە و هەندێکیش دەڵێن شارەکەیە و هۆکاریش پاشایەکی ستەمکار و کافر و طاغوط بوو، إمامی طبری و إبن کثیر لە إبن عباسەوە دەفەرمووێت ناوی "دەقیانووس" بووە کە بتپەرستی داناوە فەرمانی کردووە سوجدەی بۆ بەرن و قوربانیان لەپێناو کردووە و خەڵکەکەی ناچاری ئەم شیرکە گەورەیە کردووە گەرنا دەیکووشتن. بۆیە ئەم کۆمەڵە ئیماندارەش دەڵێن، قال الله تعالی: ﴿وَرَبَطۡنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ إِذۡ قَامُواْ فَقَالُواْ رَبُّنَا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ لَن نَّدۡعُوَاْ مِن دُونِهِۦٓ إِلَٰهٗاۖ لَّقَدۡ قُلۡنَآ إِذٗا شَطَطًا ١٤ هَٰٓؤُلَآءِ قَوۡمُنَا ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةٗۖ لَّوۡلَا يَأۡتُونَ عَلَيۡهِم بِسُلۡطَٰنِۭ بَيِّنٖۖ فَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبٗا ١٥﴾[1].

ئەمە عەقیدەی ئەم کۆمەڵە ئیماندارە بووە کاتێک داوای ئەنجامدانی عیبادەتی بتیان لێکراوە ئەوان تەوحیدیەتیەیان بۆ الله

---

[1] سورة الکهف: ١٤- ١٥

دووپاتکردووەتەوە، واتە لەسەر تەوحید بوون. بۆیە ناچارن یان دەبێت لەنێو ئەم گەلە موشریکە بمێنن و ملکەچیان بن یان هیجرەت بکەن لەپێناو پاراستی عەقیدە و ئیمانیان. بۆیە بڕیاری هیجرەت دەدەن بۆ نێو ئەشکەوت قال الله تعالى: ﴿إِذۡ أَوَى ٱلۡفِتۡيَةُ إِلَى ٱلۡكَهۡفِ فَقَالُواْ رَبَّنَآ ءَاتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحۡمَةٗ وَهَيِّئۡ لَنَا مِنۡ أَمۡرِنَا رَشَدٗا ١٠﴾[1].

ئیماندار ئاوایە لەپێناو ڕەزامەندی الله وازیان لە گەلە کافر و موشریکەکانیان هێنا پەنایان بردە بەر ئەشکەوت و هەجری قەومەکەیان کرد. بۆیە الله تعالى دەیانپارێزێت و دەیانکاتە پەندێک بۆ مرۆڤایەتی و نیشانەی شکۆ و هیممەتی ئیماندار في سبیل الله.

لەم هیجرەتانەی کە باسمان هۆکاری سەرەکی کۆچی ئیماندار کوفر و ستەمی گەلەکەیان بووە، هەروەها لەپێناو پاراستی عەقیدە و ئیمانیان بووە و في سبیل الله بووە. ئەمە واتای هیجرەتە و ئیسپاتی تەوحید و وەلائـ و بەرائەت کردنە، بەرائەتیان لە گەلە کافر و موشریکەکانیان کردووە لەپێناو ولائیان بۆ تەوحید و حب یان في الله تعالى.

١ سورة الكهف: ١٠



## باسی دووەم: هیجرەت دوای هاتنی ئیسلام

بێگومان هیجرەت في سبيل الله وەک لەپێشودا ئاماژەمان پێدا هەبووە، هەڵاتن و جێهێشتنی شوێنێکی کوفری و شیرکی بۆ شوێنێکی تر في سبيل الله لەپێناو دین و گەیاندنی حەق، گەرنا بۆ پاراستی عەقیدە و ئیمان بووە. بۆیە وەک چۆن گەلانی پێشوو شوێنکەوتوانی حەق ڕووبەڕووی ئەشکەنجە و لێدان و گرتن و کووشتن بوونەتەوە، بەهەمان شێوە ئوممەتی ئیسلام و ئەهلی ئیمان هەر دوای قۆناغی نهێنی و دوای دابەزینی ئایەتی ﴿وَأَنذِرۡ عَشِيرَتَكَ ٱلۡأَقۡرَبِينَ ٢١٤﴾ ئیدی جەنگی کوفر و ئیمانیش ئاشکرا بوو و زیادبوو زۆرینەمان ژیاننامەی پێغەمبەرمان دەزانین و دەزانین ئەوانەی سەرەتا شەهیدکران في سبيل الله کێ بوون.

بێگومان سوننەتی إلەییە گەر دەست بگریت بە حەق و هەدیی هەر چواردەورت دەبێتە دووژمن هەردوو دوژمن (شياطين الإنس والجن). زۆرینە وادەزانن هیجرەت شتێک بوو ڕووداوێک بوو تەواو، تەنیا پەیوەندی بە رسول الله و هەبوو و ئیدی کۆتایی پێهات. نەخێر، تەنانەت پێش هیجرەتی رسول الله هاوەڵان هیجرەتیان پێش هیجرەتی گەورەی رسول الله چەندان هیجرەت کرا في سبيل الله و لەپێناو عەقیدە و ئیمان ئەمانیش:

- هیجرەتی حەبەشەی یەکەم.
- هجرەتی حەبەشەی دووەم.
- هجرەتی أبوبكر الله لێی ڕازی بێت.

## ١. هیجرەتی حەبەشەی یەکەم

ئەم کۆچە دوای قۆناغی نهێنی و زۆربوونی جەنگی نێوان کوفر و ئیمان لە مەککەدا و ئازار و گرتن و کوشتنی ئیمانداران بوو. بۆیە یەکەم کۆچ دژی شیرک و کوفر کۆچی حەبەشەی یەکەم بوو، کەوا زاوای رسول الله ﷺ "عثمان بن عفان" و کچەکەی لەنێویان بوون، ژمارەی سەرووی یانزە کەس بوون ژنیشیان لەگەڵدا بوو. ئەم هیجرەتە لەکاتێک بوو رسول الله هەر لە مەککە بوو بانگەوازی تەوحیدی لەنێو موشریکانی قوڕەیش دەکرد.

## ٢. هیجرەتی حەبەشەی دووەم

دوای فراوانبوون و ئیمان هێنانی خەڵکی زۆرتر، لەهەمان کاتدا ئەشکەنجە و ئازاری موشریکان زیاتر بوو. هەم بۆ هاوەڵان و هەمیش بۆ خودی پێغەمبەر لەم ماوەدا ئازار و ئەشکەنجەی زۆری رسول اللهشیاندا، وەک چیرۆکەکانمان بیستووە لەکاتی پێداکردنی پیسایی نێو ورگی وشتر و قورگ

گرتن و هەوڵی خنکاندنی رسول الله، هیجرەتی حەبەشەی دووەم دەست پێ دەکات کە ژمارەیان زیاتر لە هەشتا کەس دەبوو وەفدەکەش "جعفر بن أبو طالب" سەرۆکیان بوو. رسول الله فەرمانی پێکردن کە بچن کۆچ بکەن بۆ ئەم ووڵاتە، چونکە پاشاکەیان دادپەروەرە و یەکسانە، بۆیە هیجرەتی دووەم لە ئیسلامدا دەست پێدەکات.

ئەوەی گرنگە تیشک بخەینە سەری هۆکاری کۆچی موسڵمانان کوفری کافران بووە و ڕێگریکردن و کوشتن و بڕینی ئەهلی ئیمان و (دار الکفری محاریب) بووە. هەروەها لەهەمان کاتدا خاڵێکی زۆر گرنگ ئەوەیە هیچ دەوڵەتێکی ئیسلامی لەسەر زەوی بوونی نەبووە. ئنجا هیجرەت کراوە و، خاڵێکی تر هیجرەت في سبیل الله ئەوەیە تۆ لە خاکێک کە کوفرو شیرکی زیاد بێت  ڕێگر بن لەبەردەم دین و تەوحیددا کۆچ بۆ شوێن و ناوچەیەکی تر بکەیت گەر ئیسلامیش نەبێت، بەڵام عەدل و چاکساز بێت.

### ٣. هیجرەتی أبو بکر الله لێی ڕازی بوو

یەکێکی تر لەکۆچەکانی في سبیل الله هیجرەتی إمامی "أبوبکری صدیقە" رضی الله عنە، بێگومان زۆرینەی موسڵمانان

لەم کۆچانە بێ ئاگان. لە صەحیح بوخاریدا هاتووە کەوا دوای ئەوەی کافران و موشریکانی قورەیش دژایەتیان بۆ ئەهلی ئیمان زیاد دەبێت و توندتر دەبن لەسەریان دەبوو، ئیزن وەردەگرێت کۆچ بکات، هۆکاری کۆچی پێشەوامان "أبوبکر" دایکمان عائیشە دەفەرمووێت ئەو بوو کاتێک قورئانی دەخوێند کەسێکی دڵناسک بوو و زوو دەگریا لەکاتی خوێندنەوەدا. بۆیە ئافرەت و منداڵانی موشریکان لێی کۆدەبوونەوە بەمەش ڕێگربوون، واتە ڕێگربوون لەبەردەم ئەنجامدانی عیباداتە کەسیەکانیش. بۆیە بڕیاری کۆچی دا، بۆیە کۆچ دەکات تا دەگاتە (برک الغماد).

خرج أبو بکر مهاجرا نحو أرض الحبشة، حتى إذا بلغ برك الغماد لقيه ابن الدغنة وهو سيد القارة ، فقال أين تريد يا أبا بكر؟ فقال أبو بكر: أخرجني قومي، فأريد أن أسيح في الأرض فأعبد ربي.

واتە لە (برک الغماد) دەگات بە "ابن دغنە" کە یەکێک بوو لەسەرکردە دیارەکان و پێی دەڵێت بۆکوێ دەچیت، ئەویش دەڵێت گەلەکەم ڕێگربوون و دەریان کردم و دەمەوێت لە زەوی پان و بەرین الله پەرستی بکەم. بەڵام "ابن دغنە" أبو بکر لەخۆدەگرێت و دەیهێنێتەوە بۆ مەککە و بە قورەیش دەڵێت

هۆکار چییه؟ ئەمانیش هۆکارەکەی پێ دەڵێن کە لەسەرەوە ئاماژەم پێداوە قورەیش مەرج بۆ أبو بکر دادەنێن کە دەبێت لە ژوورەکەی بێدەنگ عیبادەتی خۆی بکات. بەڵام أبو بکر ژوورێکی بچووک لەتەنیشت خانووەکەی دروست دەکات و قورئانی تێدا دەخوێنێت..

ئەمانە هیجرەتی سەرەتاکانی ئیسلام بوون هۆکاری هەموو کۆچەکانیش ئەوەبوو کافران ڕێگری سەختیان لە ئەهلی ئیمان دەکرد و بەگرتن و ئەشکەنجەدان و دەیان ترساندن و لە هەموو هیجرەتەکان هیچ فتوحاتێک نەکرابوو و هیچ دەوڵەتێکی ئیسلامی بوونی نەبووە کەچی کۆچ هەر هەبووە.

### ٤. هیجرەتی گەورەی و پێغەمبەر ﷺ

دوای ئەوەی رسول الله بەردەوام دەبێت لە دەعوەی تەوحید بۆ موشریکانی قورەیش و ئارام دەگرێت لەسەر ئەو هەموو ئازار و ئەشکەنجەی کە دایان لەپێناو دین. تەمەنی بانگەوازی مەککە بەنهێنی و ئاشکراوە گەیشتە سێزدە ساڵ، هەرچەند هەندێک فەرموودە دەڵێن دە ساڵ لە مەککە و دە ساڵ لەمەدینە، ئنجا وەفاتی کرد. بەڵام ڕاستییەکەی سێزدە ساڵ بووە، واتە ماوەی سێزدە ساڵ بەردەوام بوو لە دەعوە بۆ تەوحید. ئەوەی گرنگە

تیشکی بخەمە سەر رسول الله و هاوەڵانی لەم ماوەدا هیچ جۆرە دیفاعێکیان بۆ نەبوو! واتە وەکو شەڕ و بەرگری لە خۆکردن دژی موشریکانی قورەیش، تەنها ئەوە نەبێت کەوا فەرمانی هیجرەتی پێکردن ئەمیش کۆچەکانی موسڵمانانە بۆ حەبەشە:

له "خباب بن الأرت"وه رضی الله عنه دەفەرمووێت: گەر بێتو رسول الله ﷺ نەهی لێ نەکردباین (لدعوت الموت) واتە دوعای مردنمان دەکرد، بۆچی؟ لەبەر توندی و ئازاری کافران و مووشریکان بۆیان.[1]

هەروەها هەر لە "خباب"ەوە الله لێی ڕازی بێت، دەڵێت: شکونا إلی رسول الله وهو متوسدا برد فی ظل الکعبة.[2]

واتە دەفەرمووێت سکاڵای حاڵی خۆمان بردە لای رسول الله کە لەژێر سێبەری کەعبە بوو پێمان ووت ئایا دوعامان بۆ ناکەیت؟ ئایا داوای سەرکەوتنمان بۆ ناکەیت وادەبینی ئێمە چۆنین؟ دەفەرمووێت ڕەنگی تێکچوو و توڕەبوو فەرمووی گەلانی پێش ئێوە بە موشار لەنێوە ڕاست دەکران بەدوو لەتەوە،

١ له صحیح بخاری، کتاب الدعوات،دا هاتووه

٢ له صحیح بخاری،دا هاتووه

بەڵام لەدین پاشگەز نەدەبوونەوە، دەخرانە نێو ئاسنێک هەرچی گۆشت بێت دەیهاڕی بەڵام لەدین پاشگەز نەدەبوونەوە.

بێگومان وابوو هەروەک زانراوە پێغەمبەران وەک "زکریا" علیە سلام لەپێناو دین و تەوحید بە موشار لەنێوە ڕاستەوە کردیان بە دوو لەتەوە و "یحیی"ی کوڕی علیە سلام کە هەر لە منداڵییەوە الله حوکم و نبوەتی پێبەخشی وەک دەفەرموێت ﴿وَءَاتَيۡنَٰهُ ٱلۡحُكۡمَ صَبِيّٗا ١٢﴾ ئەمیش سەریان بڕی لەپێناو تەوحید.

هەروەها "إبن مسعود" دەڵێت پێغەمبەر سوجدەی دەبرد لەپاڵ کەعبە، "ابو جهل" و سەرانی قوڕەیش دانیشتبوون گوتیان کێ هەڵدەستێت بچێت پیسایی دوای منداڵ دانی وشتری فڵانی بهێنێت و بیخاتە سەریەوە کە سوجدەی برد. یەکێک هەڵدەستێت و دەیخاتە سەری لەم کاتە هەموویان لەقاقای پێکەنین دەبن، ئنجا "فاطمة" علیە سلام دێت لەسەری لادەبات ابن مسعود دەڵێت من سەیریم دەکرد لەپەنایەک، بەڵام هیچ دەسەڵاتم نەبوو.[1]

کەواتە حاڵی ئەهلی ئیمان بەمجۆرە بووە لە مەککە، بۆیە الله فەرمانی هیجرەتیان پێدەکات کە رسول الله پێش وەقت خەوی

---

١ لە صحیحین واتە بخاری ، مسلم،دا هاتووە

بینی بوو کۆچی بۆ شارێک کردبوو. ئەوەی گرنگە هیجرەتی گەورە هەڵهاتن بوو لەدەست شیرک و کوفر، بۆیە بەچەند قۆناغێک بوو.

له "براء بن عازب" الله لێی ڕازی بێت دەڵێت: یەکەمینەکانی هاتن بۆ مەدینە، واتە لە هیجرەتی گەورە، هەریەک لە هاوەڵی بەڕێز "مصعب بن عمیر" و "ابن ام مکتوم" بوو الله لێیان ڕازی بێت. ئنجا "بلال" و "سعد" و ئنجا "عمر بن خطاب" لەگەڵ بیست هاوەڵی.[١]

تەنیا رسول الله ﷺ و "ابوبكر" ماون ئیمامی "أبوبكر" دەڵێت خۆم بۆ هیجرەت ئامادەکرد ویستم بڕۆم، بەڵام رسول الله لێی نەگەڕا پێی فەرمووم پێکەوە دەڕۆین. لەم کاتەشدا موشریکانی قورەیش پلانی کوشتنی دادەڕێژن، بەڵام الله پلانەکەیان لەنێو دەبات.

بۆیە لە دایکمان عائیشەوە دەفەرموێت پێغەمبەر ﷺ هەموو ڕۆژێک نەبوو تەنیا دەبوایە بهاتبایە ماڵی "ابو بكر" چی بەشەو چی بەڕۆژ بێت. ڕۆژێکیان لەسەعاتی گەرمای خۆرهەتاو بوو هات، ئێمەش لای باوکمان بووین گوتمان ئەوە رسول اللهیە لە

---

١ لە صحیح بخاری،دا هاتووە

سەعاتێک هاتووە هەرگیز لەم کاتەدا پێشووتر نەهاتووە. دەڵێت "ابوبکر" الله لێی ڕازی بێت فەرمووی دایک و باوکم بەقوربانی بێت واللهی بۆ کارێکی گرنگ هاتووە، ئنجا کە هات "عائیشە" و "أسماء"ی لابوو. فەرمووی الله فەرمانی هیجرەتی پێکردووم لەگەڵ تۆ، "ابو بکر" گوتی، ئایا ناوی منی هێنا، فەرمووی بەڵێ. ئنجا "ابوبکر" دەڵێت ئەی رسول الله دوو ئەسپم هەیە ڕام گرتوون کامیانت دەوێت ببیە. دەفەرمووێت بە پارە دەمەوێت. ئنجا جل و کەلوپەلی سەفەریان بۆ ڕێک دەخەن هیچ شتێک نییە پێی ببەستەوە. بۆیە أسمائی کچی ابوبکر نیطاقی خۆی دەکاتە دووکەرت و پێی دەبەستەوە. بۆیە نازناوی (ذات النطاقين)ی لێنرا.[١]

بەسەرهاتەکانی هیجرەتی گەورەی رسول الله زۆرە و ئازار و نارەحەتی ڕێگای هیجرەت و کەوتنە شوێنی موشریکان بەدوایندا. تەنانەت لە ڕێگا ابوبکر دەگەڕێتەوە دەفەرمووێت "سراقە" بە سوار بەدوامانەوە بوو. رسول الله دووعای لێکرد خۆی و ئەسپەکەی خەسفی زەوی بوون. "سراقە" داوای لە رسول الله کرد ڕزگاری بکات بەڵێنی پێدا بگەڕێتەوە و بە

---

١ لە صحيح، بخاری،دا هاتووە

موشریکان بلّێت لەم ڕێگایە هیچ کەس نەبوو. بۆیە دوعای بۆ دەکات ڕزگاری دەبێت و بەڵێنەکەی دەباتە سەر.[1]

هەروەها لەنێو ئەشکەوتیش أبوبکر دەفەرمووێت ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمانە واهاتن، چی دەبێت گەر یەکێکیان خۆی نەوی بکات و بمان بینێت. رسول الله دەفەرمووێت: (یا أبابکر ماظننك بإثنین الله ثالثهما)[2].

هیجرەتی رسول الله ﷺ بە گەورەترین کۆچی ئیسلامی دادەنرێت، چونکە سەرەتای یەکەم ڕۆژی تاریخی ئیسلامی دەستی پێکردوە. یەکەم هەنگاوی جیهادی کرداری بوو دژی ئەهلی کوفر و شیرک، ئەم هیجرەتە بووە هۆی ئەوەی شتێک دروست بێت بەناوی (دەوڵەتی ئیسلام) واتە یەکەم هەنگاوی حوکمی الله لەسەر زەوی دەستی پێکرد دوای قۆناغی لاوازی لە مەککە.

---

١ صحیح بخاری

٢ صحیح بخاری

## باسی سێیەم: هیجرەت تەنیا بۆ دار الإسلامە؟

باسی کۆچ باسێکی زۆر گرنگە، بەڵام فەرامۆشکراوە و زۆرینە عیلم و زانستیان بەم باسە نییە کاتێک ناوی هیجرەت بێت ڕاستەوخۆ پێمان دەڵێن هیجرەت بۆ کوێ بکەین؟

بەر لە دروستبوونی دەوڵەتی ئیسلامی لە مەدینەوە بەر لە هیجرەتی گەورەیی ئیسلام کە کۆچی رسول الله و هاوەڵەکانی بوو بۆ مەدینە چەندان هیجرەت ڕوویدا کە باسمان کرد وەک هیجرەتی حەبەشەی یەکەم و دووەم و هیجرەتی أبوبکر الله لێی ڕازی بێتن کە ڕازی بوو. ئەم هیجرەتانە لەکاتێکدا بوو کە هیچ دەوڵەتێکی ئیسلامی بوونی نەبوو. بەڵێ کاتێک رسول الله بە هاوەڵانی دەفەرموویێت بڕۆنە حەبەشە لەوێدا پاشاکەیەکی دادپەروەری لێیە نەیووت موسڵمانە و کۆچی "ابوبکر".

کەواتە کۆچ جائیزە و دەبێت بکرێت لە زەویەک یان وڵاتێک کە کوفر و شیرکی زۆری تێدایە و ڕێگرن لە ئەهلی ئیمان و دەیانگرن و دەیانکوژن. بەڵگەش بۆ ئەمانە کاتێک موشریکانی قوڕەیش ڕێگربوون تەنانەت لەخوێندنی قورئانی "ابو بکر"، بۆیە بڕیاری کۆچکردنیدا لە (دار الکفری مککە)ی ئەم کات، بۆ زەویەکی تر کاتێک "ابن دغنە" لە إمامی أبوبکر دەپرسێت

بۆکوێ؟ دەفەرموویێت گەلەکەم دەریان کردووم، زەوی خوا فراوانە دەمەوێت عیبادەتی اللهی لێبکەم. بۆیە الله تعالی لە قورئانی پیرۆز دەفەرموویێت، قال الله تعالى: ﴿يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ أَرۡضِي وَٰسِعَةٞ فَإِيَّٰيَ فَٱعۡبُدُونِ ۝٥٦﴾[١].

لەبارەی ئەم ئایەتە ئیمامی طبری لەڕێگەی "سعيد بن جبيره"وە دەفەرموویێت: واتە گەر لە زەویەک تاوان و شیرک و کوفری لێکرا تۆش توانات نەبوو بیگۆڕیت بڕۆ جێیبهێڵە زەوی الله فراوانە. هەر "ابن جرير" لەڕێگەی "عطاء"ەوە دەڵێت واتە (هاجروا وجاهدوا)[٢].

هذا أمر من الله لعباده المؤمنين بالهجرة من البلد الذي لا يقدرون فيه على إقامة الدين ، إلى أرض الله الواسعة، حيث يمكن إقامة الدين، بأن يوحدوا الله ويعبدوه كما أمرهم; ولهذا قال: ﴿يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ أَرۡضِي وَٰسِعَةٞ فَإِيَّٰيَ فَٱعۡبُدُونِ ۝٥٦﴾[٣].

ئەمە فەرمانی اللهیە بۆ بەندە ئیمانداراەکانی بە هیجرەت کردن لە شارێک کە ناتوانن بەردەوام بن لەسەر دین و عیبادەت بۆ

١ سورة العنكبوت: ٥٦
٢ تفسير طبری
٣ ئیمامی إبن كثير لە هەمان ئایەت وتوویەتی

زەویەکی تر زەوی الله فراوانە بەهەر جۆرێک بۆ پەرستنی الله بەیەک خواپەرستی و بەمشێوەی کە فەرمانی کردووە. تفسیر ابن کثیر

هەروەها بەهەمان شێوە دەڵێت:

ولهذا لما ضاق على المستضعفين بمكة مقامهم بها، خرجوا مهاجرين إلى أرض الحبشة، ليأمنوا على دينهم هناك، فوجدوا هناك خير المنزلين، أصحمة النجاشي ملك الحبشة، رحمه الله، آواهم وأيدهم بنصره، وجعلهم سيوما ببلاده. ثم بعد ذلك هاجر رسول الله ﷺ وأصحابه الباقون إلى المدينة النبوية يثرب المطهرة.

کاتێک لاوازەکانی مەککە مەبەست ئەهلی ئیمانە زەوییان لەلا تەسک بووە، بۆ تەوحید و بەندایەتی کۆچیان کرد بۆ حەبەشە بۆ دڵنیابوون و پاراستنی دینیان کە "نجاشی" پاشای ئەمکات بوو.

کەواتە کۆچ یان هیجرەت بۆ پاراستنی عەقیدە و ئیمانە. بۆ سەلامەتی و دڵنیابوونەوە بۆ بەجێگەیاندنی ئەمر و نەهییەکانی دینە و، گرنگترین ئامانج لێی لەم ئایەتە الله بۆمان ڕووندەکاتەوە (فاعبدون)ە. کەواتە ئەو گومانانەی کەوا دروستکراون بەوەی

تاوەکو خاکێک یان وڵاتێک نەبێت حوکمی ئیسلامی لێبکرێت هیجرەت بۆکوێ بکرێت بەڵکو الله بەئایەت وەڵامی داونەتەوە کە ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە کە لە تەفسیری (البغوی) و (قرتبی) لەڕێگەی "مقاتل" و "کلبی" دەڵێن ئەم ئایەتە بۆ لاوازەکانی مەککە دابەزی وەک هاندان بۆ هیجرەتکردن.

بەمشێوەیە هەردوو هیجرەتی حەبەشەییەکان و هیجرەتی "ابو بکر" بەڵگەی بەهێزی وەڵامی ئەم گومانەن کە دەڵێن تا (دار الإسلام) نەبێت هیجرەت ناکرێت، بەڵکو بەشێک لە موفەسیران کە ئاماژەم پێدا، دەڵێت ئایەتەکە وەک فەرمانی هیجرەت هاتووە کە کۆچ بکرێت لە زەوییەک پڕ کوفر و شیرک بێت.

## باسی چوارەم: هیجرەت کەی واجب دەبێت؟

دوای ئەوەی الله دەرفەت بە بەندە هەژار و ئیماندارەکانی دەدات و دەیانکات بە فەرمانڕەوا و خاکێک و ناوچەیەکیان پێ دەدات کە تێیدا بە ئازادی و بێ ترس بتوانن عیبادەتەکانیان بکەن و تەوحید و ولاء بەرائەتیان بە ئازادی بێت حوکمی الله بچەسپێت و قورئان حاکم بێت و حەد و حدود جێبەجێ بکرێت ئەوا پێی دەڵێن خاکێکی ئیسلامی یان (دار الإسلام) وەک ئەم

کاتە ئەهلی ئیمان و لاوازەکانی مەککە هیجرەتیان کرد بۆ مەدینە لەم وەقتەدا ڕاستەوخۆ حوکم بۆ ئیسلام دەبێت و زۆرینە دەچنە پاڵ ئیسلام. بۆیە مەدینە بووە (دار الإسلام) بۆ موسڵمانان، واتە مەرجی بوونە (دار الإسلام) ئەوەیە حوکم بۆ ئیسلام بێت. بۆنمونە، کاتێک موسڵمانان هیجرەتیان بۆ حەبەشە کرد ناونەنرا بە (دار الإسلام).

کەواتە هیجرەت ئەم کاتە واجبە کە (دار الإسلام) هەبێت. بەڵام واجبەکە ئەوەیە کە هیجرەت تەنیا دەبێت بۆ ئەم خاکە بکرێت. بۆنمونە، مەدینە کە بووە خاکی ئیسلام لە مەککە و دەورووبەری هەموو چینەکان ڕوویان لەم شارە کرد و وەفد و نوێنەرەکان هەموویان دەهاتن بۆ مەدینە بۆ بەیعەت.

## باسی پێنجەم: کۆچی ئافرەتان

بێگومان ئافرەتان ڕۆڵیان هەبووە لەدین و لە سەرخستنی دیندا کە نامەوێت بچمە نێو وردەکاری، چونکە زۆر هەڵدەگرێت. بەڵام ئەوەی مەبەستمە ڕۆڵی ئافرەت بووە لە هیجرەتکردن، واتە کۆچ لە دەست کوفری کافران لەپێناو عەقیدە و ئیمان. یەکەم ئافرەتی کۆچ کار دوای کۆچی رسول الله ﷺ و

هاوەڵانی بۆ مەدینە کە ئەمیش "أم كلثوم بنت عقبة بن أبي معيط الأموية".

أن أم كلثوم بنت عقبة هي أوّل من هاجر من النساء، بعد أن هاجر رسول الله ﷺ إلى المدينة، قال: ولم نعلم قرشيةً خرجت من بين أبويها مسلمةً مهاجرةً إلى الله ورسوله إلا أمّ كلثوم بنت عقبة.[١]

واتە "أم كلثوم" کچی "عقبە" یەکەم ئافرەتی ئیماندار بووە کۆچی بۆ مەدینە کردووە دوای کۆچی رسول الله بۆ مەدینە و، دەڵێت نەمزانیووە هیچ قورەیشییەک لەدەست باوک و براکانی ڕۆیشتبێت بە ئیمانداری لەپێناو الله ڕەسولەکەی جگە لە "أم كلثوم بنت عقبة"، واتە یەکەم ئافرەتی ئیماندار. لە چەندان سەرچاوەی صەحیح هاتووە لەسەر کۆچی ئەم ئافرەتە کە بەتەنیا ڕێگای دوور و سەختی مەدینە دەگرێت لە دەست خێزانەکەی ڕادەکات لەپێناو الله و دینی الله. بەڵام لەڕێگادا هیجرەتی لەکاتی پەیمانی نێوان ئیماندار و موشریکان بوو، کە بە (صولحی حدیبیە) مەشهورە. ئەم صەحابیە بەڕێزە کاتێک کۆچ دەکات بێ ئاگایە لەوەی براکانی وەلید و عمارە ڕۆیشتوون بۆ مەدینە تا

١ ابن سعد لە (الطبقات الكبير) هێناویەتی

داوای بکەن، چونکە لەم پەیماننامەیەدا یەکێک لەمەرجەکان ئەوەیە هەریەک لە مەککە بچێتە مەککە دەبێت بگەڕێنرێتەوە. بۆیە کاتێک دەگاتە مەدینە تووشی ئەم کێشەیە دەبێت، بەڵام الله تعالی ئایەت دادەبەزێنێت لەسەری.

قال الله تعالى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا جَآءَكُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ مُهَٰجِرَٰتٍ فَٱمْتَحِنُوهُنَّ ۖ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَٰنِهِنَّ ۖ فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَٰتٍ فَلَا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى ٱلْكُفَّارِ ۖ لَا هُنَّ حِلٌّ لَّهُمْ وَلَا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ ۖ وَءَاتُوهُم مَّآ أَنفَقُواْ ۚ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ أَن تَنكِحُوهُنَّ إِذَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ ۚ وَلَا تُمْسِكُواْ بِعِصَمِ ٱلْكَوَافِرِ وَسْـَٔلُواْ مَآ أَنفَقْتُمْ وَلْيَسْـَٔلُواْ مَآ أَنفَقُواْ ۚ ذَٰلِكُمْ حُكْمُ ٱللَّهِ ۖ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ ۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ١٠﴾[١].

ئەم ئایەتە تایبەت لەسەر ئەم ئافرەتە نازل بوو بەوەی گەر کۆچیان في سبيل اللهیە لەپێناو الله و ڕەسولەکەیەتی ناکرێت و نابێت بگەڕێنرێنەوە بۆ لای کافران، چونکە حەڵاڵی یەک نین لەیەک حەڕامن.

دایکمان عائیشە الله لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت رسول الله بەم ئایەتە ئافرەتانی موهاجیری لەخۆدەگرت و داڵدەی دەدان.[٢]

---

١ سورة الممتحنة: ١٠

٢ لە صەحیح بوخاریدا هاتووە

ئنجا دواتر أم سلمه کۆچی کرد بۆ مەدینە، بەڵام لەڕێگادا تووشی کێشە دەبێت. کەواتە ئەمە دەرخەری ئەوەیە کۆچ في سبيل الله پڕ ئازار و کێشەیە، بۆیە گەورەترین پاداشتی هەیە. دواتر ئەو ئافرەتانەی کە مابوون کۆچیان کرد، چونکە زۆرینەی پیاوەکان بۆنمونە رسول الله و ابوبکر هیچ کەسێکیان لەگەڵ خویاندا نەبرد، دواتر الله دەرفەتی کۆچی بۆیان ڕەخساند.

## باسی شەشەم: هیجرەتی أبو موسا و یاوەرانی

له صەحیحەیندا هاتووە: عَنْ أَبِي مُوسَى رَضِيَ الله عَنْهُ، بَلَغَنَا مَخْرَجُ النَّبِيِّ ﷺ وَنَحْنُ بِالْيَمَن، فَرَكِبْنَا سَفِينَةً، فَأَلْقَتْنَا سَفِينَتُنَا إِلَى النَّجَاشِيِّ بِالْحَبَشَة، فَوَافَقْنَا جَعْفَرَ بْنَ أَبِي طَالِب، فَأَقَمْنَا مَعَهُ حَتَّى قَدِمْنَا، فَوَافَقْنَا النَّبِيَّ ﷺ حِينَ افْتَتَحَ خَيْبَرَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "لَكُمْ أَنْتُمْ يَا أَهْلَ السَّفِينَةِ هِجْرَتَانِ".

"أبو موسای أشعری" الله لێی ڕازی بێت یەکێک بوو له هاوەڵە بەڕێزەکان کە دوای شەش-حەوت ساڵ له هیجرەتی رسول الله کۆچ دەکات له یەمەنەوە لەگەڵ براکەی و چەند کەسێکی تر لەڕێگەی کەشتییەوە. ئەبو موسا دەڵێت گەیشتینە حەبەشە لەوێدا "جعفر بن أبو طالب"مان بینی لەوێدا مابوون

که دوای هیجرەتی دووەمی حەبەشه هەر لەوێ بوون. منیش باسەکەم بۆ "جعفر" گێڕایەوە، ئەمیش پێی گووتین بمێنینەوە تا دەرفەت ڕێکدەکەوێت بۆ کوچکردن بۆ مەدینه. دوای ماوەیەک مانەوە لە حەبەشه أبو موسا و یارانی کۆچی حەبەشەی دووەم، هیجرەت دەکەن بۆ مەدینه و دەگەنەوە خزمەت رسول الله ﷺ.

لەبارەی پلەوپایەیان ئەمانه بە (اصحاب السفینة) مەشهورن. دوو هیجرەتیان بۆ نوسراوە وەک لەم فەرموودە صەحیحەی بوخاری و موسلیمدا هاتووە کاتێک یارانی هیجرەتی حەبەشه دەگەڕێنەوە.

قَالَ: فَدَخَلَتْ أَسْمَاءُ بِنْتُ عُمَيْسٍ- وَهِيَ مِمَّنْ قَدِمَ مَعَنَا عَلَى- حَفْصَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ زَائِرَةً، وَقَدْ كَانَتْ هَاجَرَتْ إِلَى النَّجَاشِيِّ فِيمَنْ هَاجَرَ إِلَيْه، فَدَخَلَ عُمَرُ عَلَى حَفْصَةَ وَأَسْمَاءُ عِنْدَهَا، فَقَالَ عُمَرُ حِينَ رَأَى أَسْمَاءَ: مَنْ هَذِه ؟ قَالَتْ: أَسْمَاءُ بِنْتُ عُمَيْسٍ. قَالَ عُمَرُ: الْحَبَشِيَّةُ هَذِه؟ الْبَحْرِيَّةُ هَذِه؟ فَقَالَتْ أَسْمَاءُ: نَعَمْ. فَقَالَ عُمَرُ: سَبَقْنَاكُمْ بِالْهِجْرَةِ، فَنَحْنُ أَحَقُّ بِرَسُولِ اللهِ ﷺ مِنْكُمْ. فَغَضِبَتْ، وَقَالَتْ كَلِمَةً: كَذَبْتَ يَا عُمَرُ، كَلَّا وَاللهِ، كُنْتُمْ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ يُطْعِمُ جَائِعَكُمْ، وَيَعِظُ جَاهِلَكُمْ، وَكُنَّا فِي دَارِ- أَوْ فِي أَرْضِ- الْبُعَدَاءِ الْبُغَضَاءِ فِي الْحَبَشَةِ، وَذَلِكَ فِي اللهِ وَفِي رَسُولِهِ،

وَايْمُ اللهِ لَا أَطْعَمُ طَعَامًا، وَلَا أَشْرَبُ شَرَابًا، حَتَّى أَذْكُرَ مَا قُلْتَ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ، وَنَحْنُ كُنَّا نُؤْذَى وَنُخَافُ، وَسَأَذْكُرُ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ وَأَسْأَلُهُ، وَوَاللهِ لَا أَكْذِبُ، وَلَا أَزِيغُ، وَلَا أَزِيدُ عَلَى ذَلِكَ. قَالَ : فَلَمَّا جَاءَ النَّبِيُّ ﷺ قَالَتْ: يَا نَبِيَّ اللهِ، إِنَّ عُمَرَ قَالَ كَذَا وَكَذَا. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "لَيْسَ بِأَحَقَّ بِي مِنْكُمْ، وَلَهُ وَلِأَصْحَابِهِ هِجْرَةٌ وَاحِدَةٌ، وَلَكُمْ أَنْتُمْ أَهْلَ السَّفِينَةِ هِجْرَتَانِ". قَالَتْ: فَلَقَدْ رَأَيْتُ أَبَا مُوسَى وَأَصْحَابَ السَّفِينَةِ يَأْتُونِي أَرْسَالًا؛ يَسْأَلُونِي عَنْ هَذَا الْحَدِيثِ، مَا مِنَ الدُّنْيَا شَيْءٌ هُمْ بِهِ أَفْرَحُ وَلَا أَعْظَمُ فِي أَنْفُسِهِمْ؛ مِمَّا قَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللهِ ﷺ. قَالَ أَبُو بُرْدَةَ: فَقَالَتْ أَسْمَاءُ: فَلَقَدْ رَأَيْتُ أَبَا مُوسَى وَإِنَّهُ لَيَسْتَعِيدُ هَذَا الْحَدِيثَ مِنِّي.

"أسماء بنت عمس" یەکێک لە موهاجیراتی (سفینه) بوو دەچێتە لای "حفصەی کچی عمر" الله لێیان ڕازی بێت، عمر بە أسماء دەڵێت ئێمە بەپێش ئێوە کەوتین لە هیجرەت، ئێمە نزکیترین لە رسول الله وەک لە ئێوە. أسماء تورە دەبێت و دەڵێت نەخێر والله درۆت کرد، ئەی عمر ئێوە لەگەڵ پێغەمبەر بوون برسییەکانتانی تێردەکرد و نەزانەکانتانی فێردەکرد. بەڵام ئێمە لە زەوی حەبەشە بووین لەپێناو الله و ڕەسولەکەی سوێند بە الله نە ئاو نە نان ناخۆم تا بە ڕەسولی اللهی ڕانەگەیەنم و هیچی بۆ زیاد

و کەم ناکەم. ئنجا بە ڕەسول الله دەڵێت، ئەمیش دەڵێت بۆ ئەوان، واتە ئیمامی عمر و هاوەڵەکانی تەنیا یەک کۆچ هەیە واتە پاداشت. بەڵام بۆ ئێوە پاداشتی دوو کۆچ و هیجرەتان بۆ هەیە. ئنجا أبو موسا و هاوەڵەکانی هێندە بەم شتە دڵخۆش بوون بە هیچ شتێکی دونیا دڵخۆش نەبوون. کەواتە بەهۆی هیجرەت یان کۆچکردنەوە گەیشتنە ئەم پلەوپایە.

## باسی حەوتەم: سزای ئەوانەی کۆچ ناکەن

ئەم سزایە دوای ئەوەیە کەوا (دار الإسلام) دروست بێت، واتە دوای فەتحە. کەواتە لەحاڵەتێکە کە دەوڵەت یان خەلافەتی ئیسلامی بوونی هەیە.

الله تعالى لەقورئان بۆمان ڕووندەکاتەوە لەم بارەوە، قال الله تعالى: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلۡمَلَـٰٓئِكَةُ ظَالِمِيٓ أَنفُسِهِمۡ قَالُواْ فِيمَ كُنتُمۡۖ قَالُواْ كُنَّا مُسۡتَضۡعَفِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ قَالُوٓاْ أَلَمۡ تَكُنۡ أَرۡضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةٗ فَتُهَاجِرُواْ فِيهَاۚ فَأُوْلَـٰٓئِكَ مَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ وَسَآءَتۡ مَصِيرًا ٩٧﴾[1].

ئەم ئایەتە تایبەت بەوانەیە کۆچیان نەکرد و لە مەککە مانەوە نەچوونە مەدینە دواتر چوونە بەرەی شەڕ لەگەڵ موشریکان دژی

١ سورة النساء: ٩٧

ئەهلی ئیمان، واتە چوونەکەیان بەزۆر بوو. بەڵام الله بە (ظالم)ی نەفس ناوی بردوون، واتە ستەمیان لە نەفسی خۆیانکردووە، بۆ؟ چونکە هیجرەتیان نەکردووە.

ئیمامی "جریر بن طبری" لە تەفسیری ئەم ئایەتە دەڵێت:

{قَالُواْ فِيمَ كُنتُمۡ} يقول: قالت الملائكة لهم: "فيم كنتم"، في أيِّ شيء كنتم من دينكم="قالوا كنا مستضعفين في الأرض"، يعني: قال الذين توفّاهم الملائكة ظالمي أنفسهم: "كنا مستضعفين في الأرض"، يستضعفنا أهل الشرك بالله في أرضنا وبلادنا بكثرة عددهم وقوتهم، فيمنعونا من الإيمان بالله، واتباع رسوله ﷺ، معذرةٌ ضعيفةٌ وحُجَّة واهية. "قالوا ألم تكن أرض الله واسعة فتهاجروا فيها"، يقول: فتخرجوا من أرضكم ودوركم، (٢٨) وتفارقوا من يمنعكم بها من الإيمان بالله واتباع رسوله ﷺ، إلى الأرض التي يمنعكم أهلها من سلطان أهل الشرك بالله، فتوحِّدوا الله فيها وتعبدوه، وتتبعوا نبيَّه؟ يقول الله جل ثناؤه: "فأولئك مأواهم جهنم"، أي: فهؤلاء الذين وصفت لكم صفتهم. الذين توفاهم الملائكة ظالمي أنفسهم "مأواهم جهنم"، يقول: مصيرهم في الآخرة جهنم، وهي مسكنهم "وساءت مصيراً".

کاتێک مەلائیکەکان پرسیار لەمانە دەکەن دوای ڕۆح کێشان و مردن و لەکاتی مردن ئێوە چین؟ بۆچی ئەوان وەڵامیان ئەوەیە ئێمە بەشێک بووین لە چینە بێهێزەکانی زەوی کە ئیمانمان هێنا بوو لاوازبووین بەرامبەر ئەهلی شیرک و موشریکان؟ بۆیە توانای شوێنکەوتنی الله ڕەسولەکەیمان نەبوو، بەهۆی بەهێزی و ژمارەیان واتە بیانو بۆ خۆیان دەهێننەوە. بەڵام پێیان دەڵێن: ئایا زەوی الله فراوان نەبوو تا کۆچی بۆ بکەن و بڕۆن بۆ شوێنێکی تر تا بە ئازادی و بێ ترس بتوانن الله پەرستی بکەن و دین و ئیمانتان بەپاکی ڕاگرن. لەکۆتاییدا جێگایان جەهەنەمە پەنا بەالله، بێگومان سزای کۆچ نەکردن بێ عوزر زۆر ترسناکە.

هەروەها بە صەحیحی هاتووە لە "ابن عباس"ەوە الله لە خۆی و باوکی ڕازی بێت: ابن عباس أن ناسا من المسلمين كانوا مع المشركين، يكثرون سواد المشركين على رسول الله ﷺ يأتي السهم فيرمى به، فيصيب أحدهم فيقتله، أو يضرب عنقه فيقتل، فأنزل الله [عز وجل] {إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِىٓ أَنفُسِهِمْ}.

واتە کەسانێک لە موسڵمانە جێماوەکانی مەککە لەگەڵ موشریکان دەرچوون و ژمارەی کافرانیان زیادکرد بەرامبەر بە

ئەهلی ئیمان. تیرێک هات بەر یەکێکیان کەوت و کوشتی ئەم ئایەتە دابەزی: (إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِيٓ أَنفُسِهِمۡ).

بەڵام هەموو کەسێک سزای بۆ نییە ئەمانیش هەر لەئایەتی دواتر الله بۆمان ڕوونده‌کاتەوە. ﴿إِلَّا ٱلۡمُسۡتَضۡعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلۡوِلۡدَٰنِ لَا يَسۡتَطِيعُونَ حِيلَةٗ وَلَا يَهۡتَدُونَ سَبِيلٗا ٩٨﴾.

هەندێک لەپیاوان و ئافرەتان و منداڵان کەوا لاوازن و ڕێگا شارەزانین و ناتوانن خۆیان دەربازبکەن.

إبن عباس عن عبيد الله بن أبي يزيد قال: سمعت ابن عباس يقول: كنت أنا وأمي من المستضعفين من النساء والولدان.[1]

واتە من و دایکم لە بێهێزەکانی نێو مەککە بووین لە منداڵ و ئافرەتدا. هەروەها وشەی {وَلَا يَهۡتَدُونَ سَبِيلٗا}. واتە ڕێگای هیجرەتی مەدینە نازانن، ئەمانە عوذرە بۆئەوانەی کۆچیان نەکردووە. جگە لەمانە هیچ بیانوویەک نییە، بۆ نموونە کاتێک حەفتا کەس بەدیل گیران لە جەنگی بەدر لەنێویان "عباسی" مامی پێغەمبەر هەبوو. ڕەسول الله پێی دەڵێت نەفسی خۆت بکڕەوە، واتە تەعامولی موسڵمانی لەگەڵ نەکرا وەک ئیماندار سەیرنەکرا، گەرچی

---

١ بە صەحیحی هاتووە لە صەحیح بوخاری و تەفسیری إبن جریر

"عباس" دەڵێت من ئیمانم هێناوە، بەڵام رسول الله دەڵێت الله دەیزانێت.

کەواتە کۆچنەکردن بۆ خاکی خیلافەت بێ هیچ عوذرێک تاوانە و هەمان مامەڵەی کافری لەگەڵ دەکرێت لە دونیا و لە قیامەتیش الله دەیخاتە جەهەنەمەوە.

## باسی هەشتەم: دوو جۆر کۆچ هەیە

کۆچکردن و جێهێشتن دووجۆری هەیە. هەروەک مەعلومە هیجرەت یان کۆچ، واتە جێهێشتنی خاک و وڵات لەپێناو شتێک. بەڵام ئەوەی بۆ ئێمە گرنگە کە بیزانین دووجۆر کۆچکردن هەن، وەک لە فەرموودەیەکی صەحیحدا هاتووە:

عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ، قَالَ :قَالَ رَسُولُ الله ﷺ: "إِنَّمَا الْأَعْمَالُ بِالنِّيَّة، وَإِنَّمَا لامْرِئٍ مَا نَوَى، فَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى الله وَرَسُولِه فَهِجْرَتُهُ إِلَى الله وَرَسُولِه، وَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ لِدُنْيَا يُصِيبُهَا، أَوِ امْرَأَةٍ يَتَزَوَّجُهَا فَهِجْرَتُهُ إِلَى مَا هَاجَرَ إِلَيْه".[١]

---

١ إمامی بخاری ، إمام مسلم و إمام أحمد ، إمامی أبو داود و ترمزی و نسائی و بەشێکی زۆری تر لەپێشەوایان هێناویانە.

ئەم فەرموودەیە تەنها إمامی عمر ڕیوایەتی کردووە لە ڕەسول الله ﷺ، دەفەرموویت: کارو کردەوەی مرۆڤ دەگەڕێتەوە سەر نییەتی و هەریەک بەجۆرێک، هەریەک کۆچکردنی لەپێناو الله و ڕەسول اللهکەی بێت. ئەوا کۆچی بۆلای الله و رسولەکەیەتی وە هەریەک کۆچی لەپێناو دونیابێت یان ئافرەتێک تا مارەی بکات ئەوا کۆچەکەی لەپێناو ئەوانە.

بەپێی ئەم فەرموودە، دوو جۆر کۆچ هەن:

١. کۆچی دونیایی، مەبەستێکی دونیایی.
٢. کۆچی قیامەتی، مەبەستێکی قیامەتی.

لەبارەی ئەم فەرموودە لەسەر یەکێک بوو کە لە مەککەوە کۆچی کرد بۆ مەدینە لەپێناو مارەبڕینی ئافرەتێک بەناوی "أم قیس" کە مارەیی، وەک دەڵێن مەبەستێکی تایبەت و ئامانجێکی عام، هیجرەت یان کۆچ في سبیل الله ئەم کۆچەی کە ئامانج لێی تەنها الله و ڕەسولەکەیەتی. بۆنمونە یەکێک لە (دار الکفر)ێک کۆچ بکات بۆ (دار الإسلام) لەپێناو پاراستی عەقیدە و ئیمانی و سەرخستنی دینی الله وەک موهاجرین کە لە مەککە کۆچیان کرد في سبیل الله بۆ پاراستنی دین و عەقیدەیان، دواتر سەرخستنی دینی الله کەواش بوو دەوڵەتیان دروست کرد بەخوێن و ماڵ

دینیان سەرخست. ئەمانە الله پاداشتی دونیای و قیامەتی دانەوە. بەڵام ئەوانەی کە تەنانەت لەنێو (دار الکفر) بچن بۆ نێو (دار) واتە خاکی ئیسلامی، بەڵام نیەتیان الله و عەقیدە و ئیمان نەبێت، بەڵکو هەندێک مەبەستی دونیایی وەک ئەوانەی دەچن بۆ ئەورووپا لەپێناو ماڵ و سامان ئەمانە کۆچەکەیان تەنها دونیاییە هیچ پاداشتێکی قیامەتی نییە.[١]

## باسی نۆیەم: کەسێک لەماڵ دەرچێت بۆ (هیجرەت) کۆچ بەڵام بمرێت نەگاتە جێگا

الله تعالی بەڕەحمی خۆی دەیەوێت ئێمە بکاتە بەهەشتەوە . هەریەک نییەتی کارێکی هەبێت لەدڵیدا چاکە بێت، بەڵام نەیکات ئەوا پاداشتی چاکەیەکی بۆ دەنوسرێت و ئەگەر بیکات پاداشتی دەچاکە تا حەوت سەدو زیاتر[٢].

باسەکەی ئێمەش لەسەر کۆچە لەپێناو الله و دین و بڵاوکردنەوەی یەکخواپەرستی الله لە قورئان وەڵامی ئەم

---

١ لە (فتح الباری)، شرحی صحیح بخاری ، حافظ ابن حجر و منهاج شرحی صحیح مسلمی نووی

٢ لە (صحیح بخاری)دا هاتووە

پرسیارەمان دەداتەوە. قال الله تعالى: ﴿وَمَن يُهَاجِرۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ يَجِدۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُرَٰغَمٗا كَثِيرٗا وَسَعَةٗۚ وَمَن يَخۡرُجۡ مِنۢ بَيۡتِهِۦ مُهَاجِرًا إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ يُدۡرِكۡهُ ٱلۡمَوۡتُ فَقَدۡ وَقَعَ أَجۡرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ١٠٠﴾[1]. ئەم ئایەتە تایبەتە بە کەسانی کۆچکاری لەپێناو الله و دەبێتە دوو بەش:

**یەکەمیان** وەک "أبو جعفر الطبری" دەڵێت:

قال أبو جعفر: يعني جل ثناؤه بقوله: "ومن يهاجر في سبيل الله"، ومن يُفارق أرضَ الشرك وأهلَها هربًا بدينه منها ومنهم، إلى أرض الإسلام وأهلها المؤمنين (٥٨) " في سبيل الله"، يعني: في منهاج دين الله وطريقه الذي شرعه لخلقه، وذلك الدين القَيِّم (٥٩) "يجد في الأرض مراغمًا كثيراً"، يقول: يجد هذا المهاجر في سبيل الله "مراغمًا كثيراً"، وهو المضطرب في البلاد والمذْهب.

هەریەک جیابێتەوە لە شیرک و خەڵکەکەی واتە موشریکان. هەروەها هەڵبێت لەپێناو دینی بۆ زەویەک کە ئیسلام حوکم بکات و خەڵکەکەی ئیماندار بن لەپێناو الله تعالى بێت، ئەو شتەی کە دەیەوێت کە ئیقامەی دین و ئیمانیەتی بەدەستی دەهێنێت.

[1] سورة النساء: ١٠٠

وەک "إبن كثير" لە تەفسیری ئەم ئایەتە دەڵێت: { وَمَن يُهَاجِرْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ يَجِدْ فِي ٱلْأَرْضِ مُرَٰغَمًا كَثِيرًا وَسَعَةً} هذا تحريض على الهجرة، وترغيب في مفارقة المشركين، وأن المؤمن حيثما ذهب وجد عنهم مندوحة وملجأ يتحصن فيه، و {مُرَٰغَمًا} مصدر، تقول العرب: راغم فلان قومه مراغما ومراغمة، قال نابغة بني جعدة.

ئەمە هاندانی موسڵمانە بۆ کۆچکردن و ڕەغبەت و جیابوونەوە لە موشریکان و ئیماندار ئەگەر کۆچ بکات جێگا و پەناگەیەکی چاکتر دەدۆزێتەوە. واتە مەبەست لە ئیقامەی دینە، هەروەها پاراستنی عەقیدە و ئیمانیشە کە کۆچ هۆکارێکە بۆ ئەمە.

**دووەمیان** لەبارەی ئەم ئایەتەش:

{وَمَن يَخْرُجْ مِنۢ بَيْتِهِۦ مُهَاجِرًا إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ يُدْرِكْهُ ٱلْمَوْتُ} وروى معمر عن قتادة قال: لما نزلت إن الذين توفاهم الملائكة ظالمي أنفسهم الآية، قال رجل من المسلمين وهو مريض: والله ما لي من عذر! إني لدليل في الطريق، وإني لموسر، فاحملوني. فحملوه فأدركه الموت في الطريق؛ فقال أصحاب النبي ﷺ: لو بلغ إلينا لتم أجره؛ وقد مات بالتنعيم. وجاء بنوه إلى النبي ﷺ وأخبروه بالقصة، فنزلت هذه الآية ومن يخرج من بيته مهاجرا

الآية. وكان اسمه ضمرة بن جندب، ويقال: جندب بن ضمرة على ما تقدم.[١]

کاتێک ئایەتی﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِىٓ أَنفُسِهِمۡ﴾ دابەزی، یەکێک لە پیاوانی موسڵمان کە نەخۆش بوو گووتی سوێند بە الله من هیچ بیانووم نییە، چونکە ڕێگا شارەزام دەزانم. بۆیە بمبەن و دەیبەن و لەڕێگا دەمرێت هەندێک لە هاوەڵان دەڵێن ئەگەر بە ئێمە گەیشتبا پاداشتی وەردەگرت لەکاتێک لە (تنعیم) مردبوو. کوڕەکانی هاتن بۆلای پێغەمبەر ﷺ و هەواڵیان پێدا. ئنجا ئەم ئایەتە دابەزی.

کەواتە هەریەک لەماڵ دەربچێت بەنییەتی کۆچ لە بەردەرگا بمرێت پاداشتی کەسێکی موهاجیری بۆ هەیە والله أعلم. وەک دەڵێت (إنما الأعمال بالنيات).

## باسی دەیەم: پاداشتی کەسی مهاجیر-کۆچکار

بێگومان کۆچکردن في سبيل الله یەکێکە لە کارە هەرە گەورە و گرنگ و مەترسیدارەکان کە کەسی ئیماندار ئەنجامی بدات

---

١ هەریەک لە موفەسیران "طبری" و "البغوی" و زۆرێکی تر وا دەڵێن

لەپێناو دین و تەوحید و لەپێناو ڕەزامەندی الله. بۆیە گەورەترین پاداشتی لای الله دانراوە بۆ کەسێ موهاجیر. کۆچ یان هیجرەت یەکەم هەنگاوی جیهادی کردارییە کە ئەنجامی بدەیت وەک ئەهلی ئیمان کە لە مەککە کۆچیان بۆ مەدینە کرد، دوای کۆچ ئنجا جیهادیان ڕاگەیاند دژی کوفر و ئەهلەکەی. قال الله تعالی: ﴿وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ قُتِلُوٓاْ أَوۡ مَاتُواْ لَيَرۡزُقَنَّهُمُ ٱللَّهُ رِزۡقًا حَسَنٗاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ٥٨﴾[1].

ئەم ئایەتە تایبەتە بەکەسانی کۆچکار یان (مهاجر)، کاتێک کەوا کۆچ دەکەن لەپێناو الله و بەرائەت لەشیرک و کوفر دەکەن، ئنجا یان بمرن و یان بکوژرێن واتە لەجیهادا (لیرزقنهم الله).

ئیمامی "طبری" دەڵێت (الجنات) واتە ڕزقی چاک و باشی لەبەهەشت پێ دەدرێت.

قال الله تعالی: ﴿وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ فِي ٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ مَا ظُلِمُواْ لَنُبَوِّئَنَّهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٗۖ وَلَأَجۡرُ ٱلۡأٓخِرَةِ أَكۡبَرُۚ لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ٤١﴾[2].

١ سورة الحج: ٥٨

٢ سورة النحل: ٤١

خبر تعالى عن جزائه للمهاجرين في سبيله ابتغاء مرضاته، الذين فارقوا الدار والإخوان والخلان رجاء ثواب الله وجزائه.[1]

واته الله هەواڵی پاداشتی کۆچکارانمان پێدەڵێت کە لە پێناو ئەو و ڕەزامەندی ئەودا کۆچیان کرد و، ئەوەی ماڵ و حاڵ و برا و کەسیان جێهێشت بەهیوای پاداشت و ڕەزامەندی ئەو، بەوەی لە دونیادا پاداشتیان دەداتەوە و لەقیامەت زۆر بەگەورەتر پاداشتیان دەداتەوە.

هەروەها قال الله تعالى: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ يَرْجُونَ رَحْمَتَ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٢١٨﴾[2].

ئەم ئایەتەش گەورەیی پاداشتی (مهاجیر) یان کۆچکار دەردەخات و، کۆچکردن لەپێناو دین و الله بەستراوەتەوە بەئیمان بەوەی کە ئیمانیان هێنا ئنجا کۆچیان کرد، واتە لە ماڵ و حاڵ و ژینگەی خۆیان، خۆیان لەدەست موشریک و کافران ڕزگار دەکەن. پێش جیهادەکەش هاتووە واتە ئیمانیان هێنا، ئنجا کۆچیان کرد، ئنجا تێکۆشان لەپێناو الله و ئیسلامدا.

---

١ ئیمامی "إبن کثیر" لە تەفسیری ئەم ئایەتە دەڵێت

٢ سورة البقرة: ٢١٨

هەروەها قال الله تعالى: ﴿فَٱسۡتَجَابَ لَهُمۡ رَبُّهُمۡ أَنِّي لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٖ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰۖ بَعۡضُكُم مِّنۢ بَعۡضٖۖ فَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ وَأُخۡرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِمۡ وَأُوذُواْ فِي سَبِيلِي وَقَٰتَلُواْ وَقُتِلُواْ لَأُكَفِّرَنَّ عَنۡهُمۡ سَيِّـَٔاتِهِمۡ وَلَأُدۡخِلَنَّهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ ثَوَابٗا مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسۡنُ ٱلثَّوَابِ ١٩٥﴾[١]

حدثنا سفيان ، عن عمرو بن دينار، عن سلمة، رجل من آل أم سلمة، قال: قالت أم سلمة: يا رسول الله، لا نسمع الله ذكر النساء في الهجرة بشيء؟ فأنزل الله [عز وجل] {فَٱسۡتَجَابَ لَهُمۡ رَبُّهُمۡ أَنِّي لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٖ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ} إلى آخر الآية. وقالت الأنصار: هي أول ظعينة قدمت علينا.[٢]

واتە "أم سلمە" دایکی ئیمانداران الله لێی ڕازی بێتن، گوتی: ئەی رسول الله ﷺ نابیستین کەوا باسی ئافرەت کرابێت لەسەر هیجرەت یان کۆچکردن؟ ئنجا الله ئەم ئایەتەی دابەزاند کەوا گەورەیی پاداشتی کەسی موهاجیر دەردەخات لای الله تعالى.

ئایەت زۆرن لەسەر پاداشتی کەسی (مهاجر) یان کۆچکار کە بە یەکێک لەگەورەترین پاداشتەکان پاداشتیان دەداتەوە.

١ سورة آل عمران: ١٩٥

٢ لە تەفسیری ئەم ئایەتە موفەسیران واتە هەریەک لە ئیمامی طبری و إبن كثير و البغوی وایان وتووە

هەروەها لە چەندان فەرموودەی صەحیح کە ئیمامی "بخاری" و ئیمامی "مسلم" هێناویانە کەوا، (فقراء المهاجرین) چل ساڵ پێش دەوڵەمەندە ئیماندارەکان دەچنە بەهەشتەوە. ئەمەش یەکێکە لە پلە هەرە گەورەکان.

## باسی یانزەیەم: هیجرەت (کۆچ) کەی کۆتایی دێت؟

ئایا هیجرەت یان کۆچ في سبیل الله کۆتایی هاتووە یان کەی کۆتای دێت؟

عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ الله عَنْهُمَا، قَالَ : قَالَ النَّبِيُّ ﷺ يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ : "لَا هِجْرَةَ، وَلَكِنْ جِهَادٌ وَنِيَّةٌ، وَإِذَا اسْتُنْفِرْتُمْ فَانْفِرُوا".[١]

واتە عبداللە بن عباس دەڵێت رسول الله ﷺ لەکاتی فەتحی مەککەدا گوتی هیجرەت نەماوە، واتە کۆچ تەواو، بەڵکو تێکوشان و نیەت و ئەگەر داواتان لێکرا بڕۆن.

دیسانەوە لە صحیحین وارده بەمشێوە: عَنْ مُجَاشِعِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: جَاءَ مُجَاشِعٌ بِأَخِيهِ مُجَالِدِ بْنِ مَسْعُودٍ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ،

---

١ لە صحیح بخاری و مسلم و أبی داود سنن و مسندەکان ئەم فەرموودەیە هاتووە.

فَقَالَ: هَذَا مُجَالِدٌ يُبَايِعُكَ عَلَى الْهِجْرَةِ. فَقَالَ: "لَا هِجْرَةَ بَعْدَ فَتْحِ مَكَّةَ، وَلَكِنْ أُبَايِعُهُ عَلَى الْإِسْلَامِ".

"مجاشع" یەکێکە لەهاوەڵان دەڵێت "مجالدی" برام بردە لای رسول الله، گوتم ئەوە "مجالدە" پەیمانت پێدەدات لەسەر هیجرەت یان کۆچ. فەرمووی: کۆچ یان هیجرەت نەماوە دوای فەتح بەڵکو بەیعەت لەسەر ئیسلام بوون.

لەم (آثر)ەش کە لە صەحیحەیندا هاتووە لە دایکمان عائیشەوە. قَالَ عَمْرٌو، وَابْنُ جُرَيْجٍ: سَمِعْتُعَطَاءً يَقُولُ: ذَهَبْتُ مَعَ عُبَيْدِ بْنِ عُمَيْرٍ إِلَىعَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، وَهِيَ مُجَاوِرَةٌ بِثَبِيرٍ، فَقَالَتْ لَنَا: انْقَطَعَتِ الْهِجْرَةُ مُنْذُ فَتَحَ اللَّهُ عَلَى نَبِيِّهِ ﷺ مَكَّةَ.

واتە "عائیشە" رضی الله عنها پێی گوتین هیجرەت یان کۆچ پچڕا و نەما لەو کاتەوەی الله فەتحی بەڕووی پێغەمبەرەکەی کردەوە.

ئەمانە چەندان فەرموودەی وارد و دروستن هاتوون لەسەر هیجرەت گەربێت و بەڕووکەشی وەریبگرین ئەوا نابێت کۆچ بکرێت بۆ هیچ شوێنێک، چونکە دەڵێن تەواو کۆچ نەماوە. بەڵام بە موطلەقیش نییە، واتە بڵێین تەواو نەماوە، وەک لەم فەرموودەی کە هاتووە: وعن معاوية -رضي الله عنه- قال: قال

رسول الله ﷺ : "لا تنقطع الهجرة حتى تنقطع التوبة، ولا تنقطع التوبة حتى تطلع الشمس من مغربها".[١]

واته هیجرەت یان کۆچ بەردەوام دەبێت و ناپچڕێت هەتاکو خۆر لەخۆرئاواوە هەڵدێت، واتە تا قیامەت.

کەواتە ڕێگای هیجرەت بەردەوام کراوەیە لەشوێنێک بۆ یەکێکی تر لەپێناو پاراستی دین و ئیمان. بۆیە کۆچکردن لە خاکێک بۆ خاکێکی تر هەر دەمێنێت تا حوکمی کوفر بمێنێت و، هیجرەت بەردەوامە تەنانەت گەر لەشارێک بچیتە یەکێکی تر، بەڵام لەپێناو دین و تەوحید و عەقیدەدا، ئەوا بە هیجرەت بۆت حیسابە، والله اعلم.

**والحمد لله رب العالمين.**

١ رواه أحمد ، وأبو داود ، والدارمي